حکومەتا هەرێما کوردستانێ - عیراق
وەزارەتا پەروەردێ
رێڤەبەریا گشتی یا پرۆگرام و چاپەمەنییا

# کۆمپیوتەر

## مایکرۆسۆفت (ویندۆز و وورد)

## بۆ پۆلا حەفتێ بنەڕەت

**دانان**

محمد ئەبوبەکر تۆفیق
رێزان حمە رشید کریم
سۆران نەریمان حمە صالح
ئومێد صادق عبدالرکیم
هادي حمە رضا عزیز
روناك محمد عبدالله

**وەرگێران**

لیژنەکێ ژ رێڤەبەریا گشتییا پەروەردا دهۆکێ ژ زارێ کرمانجیا خوارێ کریە کرمانجیا ژووری
پێداچوون (ڕاستڤەکرن) سگڤان حسن علي / سەرپەرشیارێ بسپورێ کۆمپیوتەری / پ. دهوك

چاپا حەفتێ ٢٧١٥ کوردی ٢٠١٥ زایینی ١٤٣٦ مشەختی

# پێش گوتن (پێشەکی)

قوتابیێ خوشتڤی ناڤەروکا ڤێ پەرتوکێ دبەر دەستێ تەدایە ب شێوەیەکێ ئاسان و سادە هەوڵ ددەت وە ئاشنا بکەت ب جیهانا کۆمپیوتەری و ئەڤ بەرهەمە پشتی پێکول وماندیبوونەکا زۆر ئەم شیاین بۆ هەوەیێن خوشتڤی دانین. دیارە کۆمپیوتەر ژی دجیهانا هەڤچەرخا ئەڤرودا رۆولەکێ ئێکجار گرنگ وبەرچاڤ هەیە و پێشکەفتن وبلندکرنا ئاستێ روشنبیریا مللەت و وەلاتیدا، ب ئومێدا هندێ ئەڤ بەرهەمە مفادار بیت وچرایەک بیت بۆ پتر گەشکرنا ئایندێ تە وپتر خزمەتکرنا مللەتێ مەیە ل هەرێما کوردستا عیراقا فیدرال.

## بەشێ ئێکێ

# مێژوویا سەرهلدانا کۆمپیوتەری

قوتابیێ خوشتڤی ئەو کۆمپیوتەرێ نۆکە ل بەردەستێ تەدایە پشتی چەندین قوناغان گەهشتیە ڤی ئاستێ نۆکە، دهەر قوناغەکێدا گورانکاریەك تێدا هاتیە کرن.

ل دەسپێکێ دشێین بێژین بەری (٥٠٠پ.ز) بابلی شیان بۆ جارا ئێکێ ئامیرەکی دروستکەن وشیان مفای ژێ وەربگرن بۆ کارین (کۆمکرن، ژێك برن، لێگدان، دابەشکرن)ێ و دگوتە ڤی ئامیرەی (ئەبەکەس) پێك هاتبوو ژ دوو هێلێن تەریب دناڤبەرا واندا موریك درێژ کری بوون وپشتی ڤی ئامیرەی ئامیرەکێ دی ژلایێ (ئەمسترولاب) ڤە هاتە داهێنان، ئەڤ ئامیرە بۆ کارێن (بیرکاری، ئاسمان ناسی و جوگرافیا)مفا ژێ دهاتە وەرگرتن.

پاشی زانایێ بناڤ ودەنگێ ئینگلیزی (ولیم ئەتوو) ل سالا ١٦٣٢ ئامیرەکێ دی دروست کر ناڤێ وی کرە ( **Slide Rule**).دویڤدا زانایێ بناڤ ودەنگێ فرەنسی (باسکال) ئامیرەکێ (کومکرن، ژێك برن) ێ دروست کر بۆ هاریکاریا بابێ خۆ بۆ کارێ (باج دانێ) کو بابێ (باسکال)ی ئەڤ کارە دکر. بڤی رەنگی رۆژ بۆ رۆژ هەول و پێکولێن زانایان دبەردەوام بوون بۆ پێشڤەبرنا کۆمپیوتەری ژئەنجامێ ڤێ چەندێ ل سالا ١٨٩٦ ێ.

(د. هيدمان) ى كۆمپانيايەك دروست كر بۆ بەرهەم هێنانا كۆمپيوتەرى. ئاميرێ هەژمارتنێ ب پێنگاڤا ئێكێ يا دروست بوونا كۆمپيوتەرى دهێتە دانان، ل سالا ١٩١١ چەند كۆمپانيايەكێن دى هەڤ دوو گرتن بۆ دامەزراندنا كۆمپانيا (**IBM**) كۆ هەتا نوكە ژى ئەڤ كۆمپانيا يا بەردەوامە.

هەروەسا كۆمپانيا مايكرۆسۆفت (**Microsoft**) ب كۆمپانيايەكا گرنگ دبياڤێ كۆمپيوتەريدا دهێتە دانان وئەڤ كۆمپانيايە ژى هەتا نۆكە يا بەردەوامە، ئەڤ دوو كۆمپانيايە بمەزنترين كۆمپانيايێن بەرهەم هێنانا كۆمپيوتەرى دجيهانا كۆمپيوتەريدا دهێنە دانان.

# بەرەبابێن (نەوەیێن) دروست بوونا کۆمپیوتەری

## * بەرەبابێ (نەوەی) ئێکێ ل سالا ١٩٤٢ - ١٩٥٨:

د ڤێ قوناغێ دا ئێکەم کۆمپیوتەر هاتە دروست کرن بناڤێ (ABC) ل سالا ١٩٤٢ێ کو (٤٥) هزار تیوپ تێدا هاتبوونە بکارئینان. و قەبارێ وان گەلەك یێ مەزن بوو.

هەر چەندە ئەڤی کۆمپیوتەری سەرکەفتن بدەستڤە نەئینا، بەلێ پێنگاڤەکا باش بوو بو قوناغێن داهاتی.

و ل سالا (١٩٤٤)ێ دا زانایێ ئەمریکی هاوارد ئەیکن (Howard Aiken) کۆمپیوتەرا مارك ١ (Mark١) دروست کر شیانێن ڤی کۆمپیوتەری ئەنجامدانا کردارێن بیرکاری ودەرئێخستنا لوغاریتما ودروستکرنا خشتا بوون. کارکرنا ڤی کۆمپیوتەری برێکا خلۆکێن میکانیکی بوو، وقەبارێ وێ گەلەك یێ مەزن بوو ژبەر کو نێزیکی(٣٠٠٠)دوگمێن میکانیکی تێدا بکار ئینابوون، وکارێ وێ زۆر یێ خاڤ بوو.

و ل سالا (١٩٤٦)ێ هەردوو زانایان (J.W.Mushily) و (P.Eckert) ل زانکویا پێنسلڤانیا شیان کۆمپیوتەرەکی دروست بکەن بناڤێ (ENIAC). ئەڤ کۆمپیوتەرە وەکی کۆمپیوتەرێ (مارك ١) بوو بەلێ ل جهێ خلۆکێن میکانیکی تیوبێن بەتال (ڤالا) بکارئینان، ئەڤەژی بو ئەگەرێ لەزاتیا ئەنجامدانا کردارێت ژمێریاری پتر ژ (٢٠٠) جاران.

بەلێ ئەڤ کۆمپیوتەرە گەلەك یێ مەزن بوو ویێدڤی ب (١٥٠ م٢ ) هەبوو وگرانیا ویژی نێزیکی (٣٠ تەن) بوون، ژبلی بکار ئینانا پتر ژ(٢٠٠٠٠) تیوبێن بەتال.

هەروەسا دڤێ قوناغێدا زانایی بناڤ ودەنگ ویلکس(**Wilkes**) شیا کۆمپیوتەرێ ئیدساك دروست بکەت ل سالا (١٩٤٩)ێ کو دشیان دابوو پێزانینا دناڤ خودا ڤەگرتن.

## *بەرەبابێ دووێ ل سالا ١٩٥٨-١٩٦٤:

دڤێ قوناغێدا (ترانزستەر) ل جهێ (خلۆکێن میکانیکی وتیوبێن ڤالا) هاتنە بکار ئینان، ئەڤەژی بو ئەگەرێ کێمبونا سەنگا وێ وبچووك بوونا قەبارێ وێ و ب وزەیەکا کێم کار دکر.

## *بەرەبابێ سێێ ل سالا ١٩٦٤-١٩٧٠:

دڤێ قوناغێدا سەنگا کۆمپیوتەری کێم بوو وقەبارێ وێ ژی بچووك بوو ئەڤەژی بو ئەگەرێ کێم بوونا بهایێ وێ وپتر بەربەلاڤ بوونا وێ.

## * بەرەبابێ چوارێ ل سالا ١٩٧٠:

ل دەسپێکا سالێن حەفتێیانداتەکنلوژیا کۆمپیوتەری پێشکەفتنەکا مەزن بخوڤە دیت بۆ ئەگەرێ کۆمەکا گوهۆڕینا ژوان:

١- مێموورِیا کۆمپیوتەری پەیدا بوو کۆ شیا پتر بێزانیا دناف خودا ڤەگریت.

٢- زیدەبوونا لەزاتیا کۆمپیوتەری.

٣- بچووك بوونا قەبارێ وێ بو ئەگەرێ نزم بوونا بهایێ وێ.

٤- دەرکەفتنا گەلەك جورێن کۆمپیوتەرا.

## * بەرەبابێ پێنجی ل سالا ١٩٨٠:

دڤێ قوناغێدا دروستکرنا کۆمپیوتەرا پێشکەفتنەکا نوی بخوڤە دیت ئەوژی بکارئینانا تەکنەلۆژیا گەلەکا بچووك دقەبارەیدا، هەروەسا شیانێن ڤەگرتنا بێزانیا گەلەك بەرفرەه بوو دگەل لەزاتییەکا گەلەك زۆر، ئەڤ چەندە بو ئەگەرەك ژبو بساناهیکرنا بکارئینانا کۆمپیوتەری ونزم بوونا بهایێ وێ.



# کۆمپیوتەر وبەشێن وێ

**کۆمپیوتەر:** کۆمەکا ئامێرێن ئەلیکترونییە پێکڤە کار دکەن بۆ چارسەرکرنا پێزانینا ب رێکا پرۆگرامێن تایبەت کو هاتینە ئامادەکرن بۆ بدەستڤەئینانا ئەنجامان.




**ئێك/ ئامیرە** (Hardware)**:** هەر ئامیرەك کو دشیان دابیت دەست ڤێ بکەڤیت وئەڤ ئامیرە دبنە دوو بەش :

**أ- ئامیرێن سەرەکی :** پێك دهێن ژئەڤێن لخوارێ :

**١. کەیس** (Case) **:** سندوقەکە زوربەی پێکهاتێن کۆمپیوتەری دناڤدانە وپێڤە دگرێدایـنە،وەك ئەڤێن لخوارێ



- هارد دیسك (H.D) (Hard Disk).
- رام (RAM).
- بوردێ سەرەکی (M.B) (Motherboard).
- یەکا چارەسەرکرنا ناڤەندی (Central Processing Unit)
- پاوەرێ کارەبێ (Power Supply)
- سی دی روم (CD Rom) ....... هتد

**٢.مونیتەر**(Monitor) : ئامیرەکە دهێتە بکار ئینان بو بەرچاڤکرنا ئەنجامان.



**٣.کیبورد**(Keyboard) : ئـامیـرەکە دهـێتـەبکارئینان بو تێئێخستنا پێزانینان.

ئـەڤ ئامیرە ژکۆمەکا دوگـمان پێك دهـێت وهـەر دوگمەکێ کارەکێ تایبەت یان پتر هەیە وەك.



| دوگما سەر کیبۆردی | کارێ وێ |
| --- | --- |
| Enter | چوونا سەرێ ڕێزەکا نوی یان ئینانا ڕێزیٚ بوخوارێ |
| Caps Lock | بۆ نڤیسینا پیتێن لاتینی(ئینگلیزی) ب شێوێ مەزن |
| Shift | بۆ نڤیسینا پیتێن لاتینی ب شێوێ مەزن هەروەسا بو نڤیسینا پیتێن دکەڤنە لایێ سەری ل سەر دوکمێن کیبۆردی |
| Spacebar | بۆ دنانا بوشاییا دناڤنڤیسنێ دا وبرنا نڤیسینێ بو پێش |
| Delete | بۆ ژێبرنێ |
| Insert | بۆ زێدەکرنا نڤیسینێ |
| Home | نیشاندەرێ نڤیسینێ ڤەدگوهێزیت بۆ سەرێ ڕێزێ |
| End | نیشاندەرێ نڤیسینێ ڤەدگوهێزیت بۆ دوماهییا ڕێزێ |
| Page Up | بەرپەڕێ بەرچاڤکری دبەتە سەری |
| Page Down | بەرپەڕێ بەرچاڤکری دبەتە خوارێ |
| Num Lock | بۆ ئەکتیڤ و نەئەکتیڤ کرنا کیبۆردی ژمارا کو دکەڤیتە لایێ ڕاستێ یێ کیبۆردی |
| Backspace | بۆ ژێبرنێ و ڤەگوهاستنا نڤیسینێ بۆ پاش. |

**٤.ماوس**(Mouse) : ئەڤ ئامیرە دهێتە بکارئینان بو کونترۆلکرنا نیشاندەرێ ماوسی (**Cursor**) لسەر شاشا کۆمپیوتەری.



**ب- ئامیرێن نە سەرەکی :** پێك دهێن ژ چەند ئامیران وئەڤێن لخواری هندەك ژوانە:

**١. پرێنتەر** Printer : ئامیرەکە دهێتە بکارئـینـان بو چـاپـکرنا نڤێسـینا و وێنا وهێما ژ کۆمپیوتەرێ بۆ سەر کاغەزی.



**٢. سکانەر** Scanner : برێکا ڤێ ئامیرەی ئەم دشـێین نڤیسـینا وونێنا وهێـما بکەینە دناڤ کۆمپیوتەریدا.



*************
********
****
**

**دوو/ پرۆگرامان** Software: پێکهاتیە ژ دوو بەشان ژوان:

**أ: سیستەمێ کارکرنێ** Operating System:

ئەو سیستەمێن بەرپرس ژ کارکرنا کۆمپیوتەری وەك:

(Microsoft Dos، **Microsoft Windows**, ...)

**ب/پرۆگرامێن جێبەجێکرنێ** (Application Programs):

پێك هاتیە ژوان پرۆگرامێن دروست کری یێن ئەم رۆژانە کارێن خۆ پێ جێبەجێ دکەین وەك: (**Microsoft word** , **Microsoft excel**, ..... هتد)

## راهێنان

**لایەنێ تیوری:-**

پ ١) ئەڤێن لخوارێ پێناسە بکە:

(کۆمپیوتەر، کەیس، مونیتەر، پرێنتەر)

پ ٢) ئامێرێن کۆمپیوتەری یێن سەرەکی بژمێرە، ولسەر باخڤە

پ٣) ڤان ڤالاهیێن لخوارێ پر بکە:

١) سکانەر دهێتە بکارئینان بۆ _________

٢) ئامێرێ ماوسی ب ئامێرەکێ ________ دهێتە هژمارتن.

٣) دوگما **Enter** دهێتە بکارئینان بۆ • __________.

## مایکرۆسۆفت ویندۆز Microsoft Windows

کۆمپانیا مایکرۆسۆفت کومپانیەکا ئەمریکی یە سیستەم وپرۆگراما لسەرانسەری جیهانێ بەلاڤدکەت وخزمەتەکا مەزن پێش کێشی جیهانا کۆمپیوتەری کریە.

ئێك ژ داهینانێت ڤێ کۆمپانیێ سیستەمێ مایکرۆسۆفت ویندۆزە، مفایەکێ ئێکجار زور هەیە بو جێبەجێ کرن وئاسانکرنا کارێن مە یێن رۆژانە.

### * چاوانیا هەلکرن وڤەمراندنا کۆمپیوتەری

برێکا دوگما( پاوەر Power) دشێین هەمی پارجێن کۆمپیوتەری هەل بکەین:

ڤەمراندنا کۆمپیوتەری وەکی هەر ئامیرەکێ دی یێ کارەبایی نینە کۆ ئێکسەر ژ دوگما پاوەری بڤەمرینین، پێدڤیە هەمی پرۆگرامان بگرین پاشی بڤی شێوەی بڤەمرینین:

کلیك لسەر (start) دکەین پاشی کلیك لسەر (Turn off Computer) دکەین، پاشی دێ بۆکسەك بۆ مە لسەر شاشێ دەرکەڤیت و ئەڤ بۆ کسە ژڤان پێك هاتیە :-




**Restart** : بۆ ڤەمراندن و هەلکرنەڤەیا وی بشێوەیەکێ ئوتوماتیکی.

**Turn of**: بۆ ڤەمراندنا کۆمپیوتەری.

**Stand By**: بۆ ڤەمراندنا شاشێ بەلێ کارەب تێدا دێ مینیت ب کلیکەکێ یان لڤاندنا ماوسی یان لێدانا هەر دوگمەکا کیبۆردی دووبارە شاشە دێ زڤریتە سەر کارێ خۆ.

**Cancel**: بۆ زڤرین بۆ ناڤ پرۆگرامێن کۆمپیوتەری رامانا وێ نەهەلبژارتنا ئێك ژ هەرسێ ئایکونێن لسەری دیار کری.

# دێسك توپ Desktop




ل دەسپێكا چوونا ناڤ سیستەمێ ویندۆزی(**Windows**) روویەك دێ پێشوازیێ ل مە كەت دبێژنێ ( دیسك توب**Desktop**) رەنگەكێ تایبەت یێ هەی یان هەر وێنەیەك بیت بۆ خەملاندنا رووبەرێ شاشێ.

لسەر دیسك توبێ وژلایێ دەستێ چەپێ كۆمەكا وێنێن بچووك یێن هەین و لژێر هەر ئێكێ ناڤەك هاتیە نڤیسین وئەڤ وێنە بشێویەكێ ستوونی دبەلاڤكرینە دهێنە نیاسین بناڤێ (ئایكون **Icon** ). و ماوس ئێكە ژ هاریكارێن تۆماركرنا زانیاریان كۆ بشێوێ تیشكەبەكێ( ) لسەر شاشێ دهێتە دیتن ودبێژنێ نیشاندەرێ ماوسی (كارسەر).

بشێوەیەکێ گشتی ماوس پێك دهێت ژدوو کلیکان، هەر ئێك ژوانا کۆمەکا کاران ئەنجام ددەت.دەربارەی بکار ئینانا ماوسی پێدڤیە هەر ئێك ژمە ڤان کارێن لخوارێ بزانیت :

١. **کلیك**(Click) : بشێوەیەکێ گشتی دوو جورێن کلیکا یێن هەین:

أ) **کلیکا لایێ چەپێ**(Left Click) : پێك هاتیە ژ لڤاندنا نیشاندەرێ ماوسی بو لایێ وی ئایکونێ مەبەست پێ وکلیککرن لسەر دوگما لایێ چەبێ یا ماوسی بو ئێك جار بڤی شێوەی ئەو ئایکونا دهێتە دەستنیشانکرن ئەکتیڤ (**Active**) دبیت و ئامادە دبیت بو جێبەجێکرنا هەر کارەکی.

ب) **کلیکا لایێ راستێ** Right Click: پێك هاتیە ژ لڤاندنا نیشاندەرێ ماوسی بۆ لایێ وی ئایکونێ مەبەست پێ وکلیککرن لسەر کلیکا راستێ بۆ ئێك جار، مەبەست ژڤێ کلیکێ نە بتنێ دەستنیشان کرنە بەلکو جێبەجێکرنا ئێك ژوان فەرمانایە ئەوێن ددەمێ کلیککرنێدا دناڤ لیستەکا کورت دا دەردکەڤن.

بشێوەکێ گشتی دوگما چەبێ دهێتە بکارئینان بو کلیککرنێ ژبلی هندەك بارێن دی یێن تایبەت.

٢. **دوو کلیك** Double Click : دوو جارا کلیککرنێ (کلیکا جەبێ) لدیف ئێك بشێوەیەکێ بلەز بو جێبەجێ کرن وڤەکرنا پرۆگرامێ مەبەست پێ.

٣- Drag & Drop: پێك هاتیه ژ دوو كاران پێكڤه (كلیك + ڤەگوهاستن) (**Click + Move**) بو مەبەستا گوهۆڕینا ئەو جهێ مه دیار كری،واته كلیككرن لسەر ئایكونێ مه بڤێت وكێشانا وی بو جهێ مەبەست پێ.

قوتابیێ خوشتڤی وەكی مه لدەسپێكێ ئاماژه ب وێ چەندێ كری كو لدەسپێكا چوونا ناڤ سیستەمێ ویندۆزی (**Windows**) ڕوویەك پێشوازیا مه دكەت ودبێژنێ دیسك تۆپ (**Desktop**) كۆ ڕەنگەكێ تایبەت هەیه یان هەر وێنەیەكێ هاتبیته هەلبژارتن، لڤێرێ ئەم بۆ هەوە شێوێ گوهارتنا ڕەنگ و وێنێن ل سەر دێسك تۆپی دیار كەین:-

كلیكا لایێ ڕاستێ لسەر (دێسك تۆپ) لێ ددەین لیستەكا كورت بۆ مه دێ دەركەڤیت بڤی شێوەی :



کلیکا لایێ چەپێ لسەر (Properties) ددەین کۆ لدۆماهیا لیستا کورت دایە، لدووڤدا بۆکسەك دێ بومە هێتە بەرچاڤکرن (بنێرە وێنی دیار کری ل بەرپەڕێ ٢٠) و ئەڤ بۆکسە پێك هاتیە ژ چەند فەرمانان کۆ هەر فەرمانەکێ تایبەتمەندی ومفایێ خۆ هەیە ولڤێرێ ئەم دێ هەول دەین چەند فەرمانەکێن گرنگ ژ ڤێ بۆکسێ بۆ هەوە شلوڤە کەین.



## * گوهۆڕینا وێنێ دێسك توپی (Desktop Background)




بو گوهۆڕینا وێنێ دیسك توپی کلیکا چەپێ لسەر بەرپەڕێ (**Desktop**) ی بکە، دیسان بۆکسەکا دی بو تە دێ ڤەبیت ودناڤ لاکێشا **Background** وێنێ تە بڤێت هەلبژێرە وپاشان کلیکەکێ لسەر (**Apply**) بدە وپاشی (**OK**) ئێکسەر ئەو وێنێ تە هەلبژارتی دێ لسەر شاشا کۆمپیوتەری هێتە بەرچاڤکرن. هەروەسا دشیاندایە کلیکێ لسەر (**Browse**) بکەین بۆ ئینانا وێنەکێ دی کو لجهەکێ دی هاتبیتە ڤەگرتن.



## * دانانا سکرین سەیڤەری (Screen Saver) وگوهۆرینا وی

ئێك ژ بەرپەرێن ڤی بۆكسێ فەرمانێ (**Screen Saver**)ە كۆ دهێتە بكارئینان بۆ دانا بهێن ڤەدانەكێ بۆ شاشا كۆمپیوتەری وپاراستنا وی.




ئەڤ فەرمانە پێك هاتیە ژكۆمەكا وێنێن لڤۆك ددەمەكیدا ئەگەر تە چ كار ئەنجام نەدان لدەمێ د لاكێشا (**wait**)دا، وێنێ هەلبژارتی بۆ (**Screen Saver**)ی دێ هێتە بەرچاڤكرن .

بۆ نموونە: ئەگەر كۆمپیوتەرێ هەلكری بیت وبۆ دەمێ (١٠) خۆلەكا چ كار پێ نەهاتە كرن دوی دەمیدا كەڤیتە كاری و وێنەكێ لڤۆك لسەر شاشێ دێ دەركەڤیت ودشیاندایە ئەو وێنە بهێتە گوهارتن برێكا هەلبژارتنا وێنەكێ دی دنالاكێشا (**Screen Saver**)دا وەكی د وێنێ سەریدا دیار.

هەر وەكو مە بەری نوكە دیار كری كۆ لسەر **Desktop** ژلایێ دەستێ چەبێ كۆمەكا وێنێن بچووك هەنە بشێوێ ستوونی ئێك لدووف ئێكە وهەر ئێكێ ناڤەك هەیە كو دبێژنێ (ئایكون**Icon**) لڤێرێ دێ رێكێن ڤەگوهاستنا وان ب ئازادی بو جهەكێ دی و دووبارە رێزكرنا وان دیار كەین.

بۆ ڤەگوهاستنێ ( كلیككرن لسەر ئایكونێ مەبەست پێ بو گوهۆرینا جهێ وی پاشی بەردەوام تبلا تە لسەر كلیكێ بیت و ماوسی راكێشە بۆ وی جهێ تە بڤیت وپاشان تبلا خۆ ل سەر ماوسی بەردە، ئەڤێ رێكێ دبێژنێ (**Drag & Drop**) ).

بۆ رێزكرنا ئایكونان (كلیكا راستێ یا ماوسی لسەر جهەكێ ڤالا ل(**Desktop**) بكاربینە، ژ لیستا كورت ئەوا دەردكەڤیت (**Arrange Icon by name** ) هەلبژێرە ئێكسەر چەند رێكێن رێزكرنێ دێ هێنە دیار كرن وەك رێزكرن لپەی (ناڤی، قەبارە، جۆر،.. هتد) ئایكونی.



و ل بەشێ خوارێ یێ (Desktop) ی شەریتەك یا هەی دبێژنێ (Task Bar) ویا بەرپرسە ژكۆمەكا كاران ئەوژی :




١. ل دەستێ راستی یێ ڤێ شەریتێ دەمژمێرەك یا هەی و دەم بەروارا وێ روژێ نیشا مە ددەت. و بۆ رێكخستنا دەمی و مێژوویا كۆمپیوتەری تە چەندین رێكێن هەین وئەڤە بساناهیترین رێكە :

**پێنگاڤا ئێكێ** : دوو كلیكا **Double Click** ل سەر دەمژمێرا دیار كری لسەر تاسك باری لێ ددەین.

**پێنگاڤا دووێ**: ژئەنجامێ پێنگاڤا ئێكێ بۆكسەك بو مە دێ دەركەڤیت بڤی شێوەی: دناڤ ڤێ بۆكسێدا دشیاندایە ولدووڤ حەزا خۆ دەم ژمێر ومێژوویا كۆمپیوتەری بگوهۆرین



٢- بەشەکێ دی یێ هەی تێدا (En , Ar ...) هاتیە نڤیسین د بێژنێ (Language Bar) کارێ ڤێ بەشی کونترۆلکرنا وی زمانیە ئەوێ تە بڤێت بۆ کارکرنێ.

٣- کۆفکا دەنگی (speaker) کۆ لسەر شەریتی دبێژنێ (Volume) دهێتە بکارئینان بو زێدەکرن وکێم کرنا دەنگی دکۆمپیوتەریدا.




٤- ل دەستێ چەپێ یێ ڤێ شەریتێ دوگمەکا کەسك یا هەی لسەر نڤێسیە (Start) برێکا وێ دەست بکاری دهێتە کرن وچوون بۆ ناڤ پرۆگرامان وبڤی شێوەی:-

کلیك لسەر Start د دووڤدا all programs دێ ڤەکەین لیستەك دێ دەرکەڤیت ناڤێن وان پرۆگرامان هەمیان دێ دەرکەڤن ئەوێن دکۆمپیوتەریدا هەین، برێکا ڤێ لیستێ ئەو پرۆگرامێ مە بڤێت دێ

ڤەکەین وکارێ خو یێ رۆژانە ئەنجام ددەین.

هەروەسا شەریتا تاسك بار بەرپرسە ژ نیشادانا ناڤێتن هەمی پرۆگرامێن ڤەکری د سیستەمیدا، بڤێ چەندێ ئەم دزانین چەند پرۆگرام دڤەکرینە ونەهاتینە دائێخستن. بەلێ ژڤان چەند پرۆگرامان ئێك پرۆگرام بتنێ یێ ئەکتیڤ (**Active**)ە تودشێی کاری لسەر بکەی. ئەو پرۆگرامێ دهێتە ڤەکرن لسەر تاسك باری دهێتە نیشان دان، ودشیاندایە ژ پرۆگرامی بچیە دناف پرۆگرامێ دیدا ئەوژی بریکار کلیککرن لسەر ناڤێ وی پرۆگرامی لسەر تاسك باری.

## چاوانیا دروستکرنا فولدەرەکی (Folder)

فولدەر **Folder** :جهەکێ تایبەتە وناڤەکێ دەست نیشانکری یێ هەی دهێتە بکار ئینان بو هەلکرتنا فایلان هەروەسا دشیاندایە فولدەرکی دناف فولدەرەکیدا هەلبگرین، وبڤی شێوەی ئەم دشێین فولدەرکی دروست کەین :

١. کلیکا راستێ ل سەر (**My computer**).
٢. کلیککرن لسەر **Explorer** .
٣. درایڤەکی دەست نیشان دکەین بو نموونە (**D**).
٤. کلیککرن لسەر **File**.
٥. کلیککرن لسەر **New** .
٦. کلیککرن لسەر **Folder** .
٧. نڤیسنا ناڤێ وی فولدەری.

## کورتکرن (shortcut) کرنا فایلان و فولدەران

بو کورتکرنا فایلان وفولدەران جەند رێکێن هەین وبساناهی ترین رێك بڤی شێوەی یە:

١. دەستنیشانکرنا وی فایلی یان فولدەری.
٢. کلیککرن لسەر لیستا **File**.
٣. کلیککرن لسەر **Create shortcut**.

# گوهۆڕینا ناڤێ فایلی یان فولدەری

بو گوهۆڕینا ناڤێ فایلی وفولدەری چەند رێكێن هەین وبساناهی ترین رێك بڤی شێوەی یە:

١. وی فایلی یان فولدەری دەست نیشان بکە.

٢. دناڤ لیستا **File** دا کلیککرن لسەر فەرمانێ **Rename**.

٣. ناڤێ نوو بنڤیسە.

بکار ئینانا ژمێریارێ (**Calculator**)

**Start → All programs → Accessories → Calculator**




**Calculator** : ئێکە ژ پرۆگرامێن جێبەجێ کرنێ ودناڤ هەمی ڤێرژنێت سیستەمێ ویندۆزیدا یا هەی، دهێتە بکار ئینان بۆ ئەنجامدانا کریارێن ژمێریاری.

دلیستا **View** دا دشیاندایە شێوێ ژمێریارێ بگوهۆرین کو بشێین هەمی کردارێن بیرکاری وئامارێ جێبەجێ بکەین برێکا کلیککرن لسەر **Scientific**.

بۆ بکارئینانا ئەنجامەکێ دیار کری لسەر شاشا ژمێریارێ (**Calculator**) دپرۆگرامەکێ دیدا دشێین فەرمانێ **copy** دلیستا **Edit** دا هەلبژێرین ودناڤ پرۆگرامێ مەبەست پێ دێ فەرمانێ **Paste** دناڤ لیستا **Edit** دا هەلبژێرین. دشیاندایە دوگمێن سەر کیبۆردی بکار بینین بو نڤیسینا ژمارا وهێمایا (+ ، − ، × ، ÷) ل جهێ کلیککرنێ لسەر دوگمێن ژمێریاری، ودوگما **Enter** لسەر کیبۆردی ل جهێ (=) کار دکەت.

# پرۆگرامێ وێنە کێشانێ Paint

پرۆگرامەکێ ب ساناهیە بو وێنەکێشانێ، مفایەکێ زۆر هەیە




ژلایێ ڕاهێنانێن دەستی بۆ بکارئینانا ماوسی بۆ وان کەسێن تازە فێری کۆمپیوتەری دبن.

**ڤەکرنا پرۆگرامی بڤی شێوەیە :**

**Start → All programs → Accessories → paint**

دشێوێ ڤی پرۆگرایدا دیار دبیت کو پێکهاتێن سەرەکی یێن ڤی پرۆگرامی وەکی هەمی پرۆگرامێن دی یە کۆمەکا شەریتا دناڤدا دووبارە بوینە دگەل چەند شەریتێن تایبەت بڤی پرۆگرامی ڤە کو تایبەتن بکێشانا وێنان،وەك شەریتا ڕەنگا وشەریتا کەرستێن وێنەکێشانێ.

١. بۆ دیارکرنا بەشەکێ وێنەی بشێوەکێ ئازاد.

٢. بۆ دیارکرنا بەشەکێ وێنەی بشێوێ چوار گوشە یان لاکێشەی.

٣. بۆ ژێبرنێ (ژێبەر).



٤. بۆ رەنگکرنا بەشەکێ دیارکری یێ گرتی.

٥. بۆ هەلگرتنا رەنگی.

٦. بۆ مەزن کرن وبچووککرنا بەشەکی.

٧. بۆ نڤێسین وکێشانا وێنەی بشێوەکێ ئازاد.

٨. فرچە.

٩. بویاغکرن برێکا پەمپێ.

١٠. A بۆ نڤێسینێ ب رێکا کیبۆردی.

١١. بۆ کێشانا هێلا.

١٢. بۆ دروستکرنا هێلێن چەماندی.

١٣. بۆ دروستکرنا چوار گوشەیەکێ یان لاکێشەکێ گوشە(ستووین).

١٤. بۆ دروستکرنا شێوەکێ چەند لایەن وەکی (سێ لا چوار لا ...هتد)

١٥. بۆ دروستکرنا بازنەکی

١٦. بۆ دروستکرنا چوار گوشەکێ یان لاکێشەکێ گوشە (چەماندی)

د هەمان دەمدا مە بۆكسەكا رەنگا یا هەی دەمێ كلیكێ لسەر هەر رەنگەكی بكەین دشیاندایە ب وی رەنگی كار بكەین.




ئەو فایلێن بریێیا ڤی پرۆگرامی دهێنە دروست كرن ناڤەروكا وی پێكهاتیە ژ وێنا ونڤیسینێ وشێوێن جیاواز.

وەكو هەمی پرۆگرامێن دی ئەڤ بەرنامە پێك هاتیە ژ كۆمەكا لیستا هەر ئێك ژوان كۆمەكا فەرمانێت تایبەت دناڤدایە.

# شەریتا لیستا Menu Bar

## لیستا فایل File

File | Edit | View | Image | Colors | Help

| | |
|---|---|
| New | Ctrl+N |
| Open... | Ctrl+O |
| Save | Ctrl+S |
| Save As... | |
| From Scanner or Camera... | |
| Print Preview | |
| Page Setup... | |
| Print... | Ctrl+P |
| Send... | |
| Set As Background (Tiled) | |
| Set As Background (Centered) | |
| Recent File | |
| Exit | Alt+F4 |

* **New**: بۆ ڤەکرنا فایلەکێ نوویە.

* **Open**: بۆ ڤەکرنا فایلەکێ هەلگرتی یە (ڤەگرتیە).

* **Save** : بۆ هەلگرتنا (ڤەگرتنا) گوهۆڕانکاریێن فایلی وهەرووەسا بۆ هەلگرتنا فایلەکێ نوو دوی دەمیدا بۆکسەك دێ ڤەبیت کو دناڤدا دێ ناڤ و وجهێ فایلی دیار کەین وهەلگرین.

* **Save as** : ئەڤ فەرمانە ددەمەکیدا دهێتە بکار ئینان ئەگەر مە بڤێت گوهۆرینەکێ ل فایلەکیدا بکەین وبناڤەکی دی ڤەگرین یان ل درایڤەکێ دی ڤەگرین هەرووەسا بوهەلگرتنا (ڤەگرتنا) فایلەکێ نوویە.

* **From Scanner or Camera** : بۆ وەرگرتنا وێنان ژ سکانەری یان ژ کامیرێ.

* **Print Preview** : بۆ بەرچاڤکرنا بەرپەڕی بەری چاپکرنێ.

* **Page Setup** : بۆ ئامادەکرنا بەرپەڕی وب کلیککرنێ لسەر **Page Setup** : بۆکسەك دێ بۆ مە دەرکەڤیت کۆ دشیاندایە تایبەتمەندیێن بەرپەڕی دەستنیشان بکەین.

* **Print** : بۆ چاپکرنا فایلێ

## لیستا Edit

Edit View Image Colors
Undo Ctrl+Z
Repeat Ctrl+Y
Cut Ctrl+X
Copy Ctrl+C
Paste Ctrl+V
Clear Selection Del
Select All Ctrl+A
Copy To...
Paste From...

* **Undo** : لێ زڤرین ژپێنگاڤا دوماهیێ.

* **Redo** : ڤەگەریان بۆ پێنگاڤا ئەم لێ زڤرین.

* **Cut** : بۆ برینا بەشەکێ دیار کری.

* **Copy** : بۆ کوپی کرنا بەشەکێ دیار کری.

* **Paste** : نیساندنا ئەو بەشێ هاتیە برین یان کوپی کرن.

* **Clear Selection** : بۆ ژێبرنا وی بەشێ دیار کری.

* **Select All** : بۆ دەست نیشانا کرنا هەمی بەرپەری.

* **Copy To** : بو کوپی کرنا بەشەکێ دیار کری بو فایلەکێ دی.

* **Paste From** : نیساندنا وێنەی دناڤ فایلیدا بەلێ دڤێت ئەو فایلێ ژێ دهێتە وەرگرتن بهێتە دیار کرن.

## لیستا View

* Tool Box : بۆ بەرچاڤکرن وراکرنا ڤەشارتنا ( سندوقا ) کەرەستان.

* Color Box : بۆ بەرچاڤکرن وراکرنا ( ڤەشارتن ) سندوقا رەنگا.

* Text Toolbar : بۆ بەرچاڤکرنا ( ڤەشارتنا ) شەریتا (Font)ی د دەمێ ئەم نڤێسینێ بکاربینین

* Zoom : بۆ چاوانیا بەرچاڤکرنا وێنا، دڤێرێدا لیستەك دێ ڤەبیت ودناڤ دا (Normal Size) بۆ بەرچاڤکرنا وێنەی بشێوەکێ ئاسایی وهەروەسا (Large Size) بو بەرچاڤکرنا وێنەی بشێوەکێ مەزن، ودوی دەمیدا (Show Grid , Show Thumbnail) دێ ئەکتیڤ بن ومفایدێ ژێ هێتە وەرگرتن بۆ هندێ پتر ووردەکاریا د وێنەیدا بکەین.

* View Bitmap : کلیککرنا وێنەی یان نڤێسینێ دێ شاشە هێتە پڕکرن.

## لیستا Image

| Image | Colors | Help |
|---|---|---|
| Flip/Rotate... | Ctrl+R | |
| Stretch/Skew... | Ctrl+W | |
| Invert Colors | Ctrl+I | |
| Attributes... | Ctrl+E | |
| Clear Image | Ctrl+Shft+N | |
| ✔ Draw Opaque | | |

* **Flip/Rotate** : کلیککرن لسەر دێ بۆکسەك بومە ڤەبیت، وبۆ زڤراندنا وێنێ مە دهەر بارەکیدا دهێتە بکارئینان وەك :

* **Flip Horizontal** : زڤراندنا وێنێ مە دبارێ ئاسوییێ دا.

* **Flip Vertical** : وێنێ مە دبارێ ستوونیدا دێ هێتە زڤراندن و **Rotate by angle** دا سێ پلە مە یێن هەین بو زڤراندنا وێنەی.

* **Stretch/Skew** : بۆ بچووککرن ومەزن کرنا پانی و درێژایا رووبەرێ وێنەی دهێتە بکارئینان.

* **Invert Colors** : ئەڤ فەرمانە دهێتە بکار ئینان بۆ پێچەوانەکرنا رەنگا.

* **Attributes** : بۆ بچووککرن ومەزن کرنا رووبەرێ وێنەکێشانێ.

* **Clear Image** : بۆ ژێبرنا هەمی وێنەی.

## راهینان

*** لایەنێ تیوری :**

پ ١) ئەڤێن لخوارێ پێناسە بکە :

(**Desktop , Restart , Folder**)

پ ٢)فولدەرکی دروست بکە بناڤێ (کوردستان) لسەر درایڤێ (**D**)

*** لایەنێ پراکتیکی :**

پ) دناڤ پرۆگرامێ (**Paint**) دا ولدووڤ حەزا خو وێنەکێ سروشتی ڕاکێشە (بکێشە) بناڤێ خو لسەر درایڤێ (**D**)ڤەگرە.

# بەشێ سێیێ

## مایكرۆسۆف وورد Microsoft Word

كۆمپانیا مایكرۆسۆف ئێكە ژبەرنیاسترین كومپانییێن جیهانی، كۆ داهینەرا گەلەك پرۆگرامێن كۆمپیوتەری یە كۆ دناف سیستەمێ ویندۆزیدا كار دكەن .



مایكرۆسۆفت ئوفیس (**Microsoft Office**) پێك دهێت ژ كۆمەكا پرۆگرامان وئێك ژوان پرۆگرامان پرۆگرامێ مایكرۆسۆفت وورد (**Microsoft Word**) ە.

پرۆگرامێ مایکرۆسۆفت وورد ل سەرانسەری جیهانێدا پرۆگرامەکێ تایبەتە بنڤێسینێ ڤە، کو دناڤدا  نڤیسین بهەمی جوراڤە ودانانا وێنا وشێوێن جۆرا وجۆر و بۆدروستکرنا خشتان دهێتە بکار ئینان.

بو  چوونا دناڤ پرۆگرامێ ووردیدا لدەسپێکێ کلیکێ ل **Start** بکە پاشی **All Programs** هەلبژێرە، دڤێرێدا لیستا پرۆگرامان دێ ڤەبیت پاشی دێ نیشاندەرێ ماوسی بەینە سەر (**Microsoft Word**) ی ودێ کلیك کەین پرۆگرام دێ بۆ مە هێتە ڤەکرن.

**Start → All programs → Microsoft Word**

یان

**Start → All programs → Microsoft → Office Microsoft Word**

# پێکهاتێن سەرەکی یێن پرۆگرامێ مایکرۆسۆفت وورد




پشتی ڤەکرنا پرۆگرامێ **Microsoft Word** بەشێن سەرەکی یێن پرۆگرامی دێ بڤی شێوەی بن :

**١) Title Bar شەریتا ناڤ ونیشانا :**




لسەری روویێ پرۆگرامی چەند ئایکون تێدانە وەك (**Close, Restore Down, Minimize**) وناڤێ پرۆگرامی وناڤێ فایلی (دوکیۆمێنتی).

## ٢) Menu Bar شەریتا لیستا :

File Edit View Insert Format Tools Table Window Help

لسەر ڤێ شەریتێ ناڤێن هەمی لیستێن پرۆگرامی دهێنە دیار کرن وەك لیستێن ( File, Edit, View, Insert, Format, Tools, Table, Window, Help) و لدووڤ جورێ کاری فەرمانێن پرۆگرامی هاتینە دابە شکرن لسەر ڤان لیستان

## ٣) Toolbars شەریتا کەرەستان :




کۆمەکا شەریتانە وهەر شەریتەك پێك هاتیە ژ چەندین ئایکونان کو هەر ئایکونەك ب شێوێ وێنەیەکی دیار دبیت و بۆ مەبەستەکا تایبەت ب کاردهێت، وژمارا شەریتا و ئایکونا ژی دشیاندایە بگوهۆرین.

## ٤) Rulerراستە : بو پیڤانێ بکاردهێت.



**٥-کارسەرا I (نیشاندەرێ نڤێسینی) :** نیشاندەر ئەو هیمیایە ئەوێ دکەڤیتە سەر روویێ بەرپەرێ وجهێ نڤیسینێ بۆ مە دیار دکەت ولدووڤ پێتڤیا خۆ دشێین بکار بینین.

**٦) تاسك پەين** Task Pane **:** ليستەكە دكەڤيتە بەشێ لايێ راستێ يێ روويێ پرۆگرامى،لبەشێ سەرى ناڤێن وان فايلا ديار دكەت ئەوێن بەرى نوكە هاتينە ڤەگرتن ونوكە دڤەكرينە وكارى تێدا دكەى، دگەل چەندين فەرمانێن دى فەرمانێ (**close**) ئەوێ ديار لسەر ڤێ ليستێ دهێتە بكارئينان بۆ گرتنا ليستێ.

**٧)**Page **:** جهەكێ تايبەتە ب كارێ نڤيسينێ ڤە و ل هەر جهەكێ تە بڤێت لدووڤ جهێ كارسەرى(نيشاندەرێ نڤيسينێ).

**٨)** Status bar **شەريتا بارێ نوكە :** ئەڤ شەريتە دكەڤيتە لاى خوارێ يێ پرۆگرامى كو ژچەند زانياريەكا پێكهاتيە وەك( ژمارا بەرپەڕێ نوكە يێ دۆكيومينتێ كارى تێدا دكەى، وژمارا بڕگا وريێزا وپيتان..... هتد).

پێكهاتا دەرڤە يا ڤى پرۆگرامى وەكو هەمى پرۆگرامێن دى پەنجەركە كو ژ كۆمەكا شەريتێن كەرەستان تێدانە، و ژ شەريتێن گرنگ (**Sstandard Toolbar**) و (**Formatting Toolbar**) و (**Table Toolbar** ) و(**Drawing Toolbar**) و (**Drawing Toolbar**) ە كو پتريا پێدڤيێن مە يێن روژانە دناڤدا كومبووينە.

# چاوانیا نڤیسـینێ د پرۆگرامێ (مایکرۆسۆفت وورد)دا

**١. ب ئینگلیزی :**

بۆ گوهۆڕینا جورێ نڤیسینێ ژ عەرەبی بو ئینگلیزی دێ( Ctrl +Shift) یان (Alt + Shift) یا لایێ چەپێ یێ کیبۆردی لێ دەین یان ل سەر شەریتا (Task Bar) (Ar)  دێ کەینە (En) ول جورێ فونتادا فونتەکێ ئینگلیزی هەلبژێرین وەك :

**Times New Roman**

ودێ دەست بنڤیسینا خو کەین لسەر کیبۆردی ب بیتێن ئینگلیزی وپیتێن مە دێ بچووك (Small) هێنە نڤیسین، بەلێ ئەگەر دەستێ خو ل دوگما (Caps Lock) بدەین پیتێن مە دێ مەزن(Capital)  هێنە نڤیسین یان ژی دەستێ خو لسەر دوگما (Shift) دانین ورانەکەین ودەست بنڤیسینێ بکەین دێ پیتێن مە بشێوێ مەزن (Capital) هێنە نڤیسین.

**٢.ب عەرەبی وکوردی :**

بۆ گوهۆڕینا جورێ نڤیسینێ ژ ئینگلیزی بو عەرەبی دێ ( Ctrl +Shift) یان (Alt +Shift) یا لایێ راستێ یا کیبۆردی لێ دەین یان ل سەر شەریتا (Task Bar) (En) دێ کەینە (Ar) و دناڤ جۆرێن فونتادا فونتەکێ عەرەبی دێ هەلبژێرین وەك :

**Ali_A_Jiddah , Ali_A_Samik ……**

بەلێ بۆ زمانێ کوردی دناڤ جۆرێن فونتادا دڤێت فونتەکێ کوردی هەلبژێرین وەك :

**Ali_K_ Jiddah , Ali_K_Samik , Zanest Govar ,......**

بۆ نڤیسینا بزمانێ کوردی ئەم مفای ژ پیتێن عەرەبی وەردگرین بتنێ چەند پیتەك نەبن ژبەر گوهۆڕانکاریەك لسەر پیتێ دهێتە کرن وەك :-

| پیتا سەر کیبۆردی | پیت ب کوردی |
|---|---|
| ث | پ |
| ض | چ |
| ط | گ |
| ظ | ڤ |
| ؤ | ۆ |
| ء | ۆ |
| ذ | ژ |
| ة | ە |

**تێبینی :**

١.Shift +K = (فاریزێ) بوبێنوك

٢. Shift +Q=بو نڤیسینا حەفتێ لسەر پیتێ

٣. Shift +A= بو نڤیسینا حەفتێ ل ژێر (بن) پیتێ

٤.Del = بو خالێ یان کوم دانانێ

## شەریتا کەرەستێن ڕێکخستنێ Formatting Toolbar



Zanest _ Govar بو گوهۆڕینا جۆرێ فونتێ نڤیسینێ دهێتە بکارئینان ودهێتە نیاسین بناڤێ فونت (**font**).

19 **Font size**: دهێتە بکارئینان بو گوهۆڕینا قەبارێ نڤێسینی (بچووککرن و مەزن کرنا نڤیسینێ ).

**نموونە:**

کۆمپیوتەر قەبارە ١٠

کۆمپیوتەر قەبارە ١٥.

**کۆمپیوتەر قەبارە ٢٢**

B **Bold** : دهێتە بکارئینان بو توخ کرنا نڤیسینێ.

**نموونە:**

پەیڤا (کوردستان) پشتی (**Bold**) دێ بیتە (**کوردستان**)

I **Italic**: دهێتە بکارئینان بو نڤیسینی بشێوێ ئیتالی (خوار).

**نموونە:**

پەیڤا (کۆمپیوتەر) پشتی (**Italic**) دێ بیتە (*کۆمپیوتەر*)

**Under Line** : دهێته بكارئینان بو دانانا هێلەكێ ل بن نڤێسینێ.

**نموونه:**

پەیڤا (زانست) پشتی **Under Line** دانانا هێلەكێ لبن. (زانست)

**Align Left** : دهێته بكار ئینان بو گوهۆڕینا ئاراستێ بڕگەی بۆ لایێ جەبێ یێ بەرپەڕی.

**نموونه:**

هەریما كوردستانێ

**Center** : دهێته بكار ئینان بو گوهۆڕینا ئاراستێ بڕگەی بۆ ناڤەندا ریزێ.

**نموونه:**

هەریما كوردستانێ

**Align Right** : دهێته بكار ئینان بو گوهۆڕینا ئاراستێ بڕگەی بۆ لایێ راستێ یێ بەرپەڕی.

**نموونه:**

هەریما كوردستانێ

**Justify** :دهێته بكار ئینان بو رێك وپێكرنا نڤیسینا بڕگا ژ هەردوو لایان ڤە (راست وچەپ) ئەگەر ئینتەر(**Enter**) نەهاتبیتە بكار ئینان لدوماهیا رێزان.

**نموونه :**

کۆمپیوتەر ئامیرەکێ ب بهایە دژیانا مەدا کۆ مفایەکێ زۆر ژێ دهێتە وەرگرتن بو برێڤەبرنا کار وبارێن مە یێن رۆژانە.

Font Color: دهێتە بکار ئینان بو گوهۆڕینا رەنگێ نڤیسینێ .

**نموونه :**

| | |
|---|---|
| وەزارەتا پەروەردێ | وەزارەتا پەروەردێ |
| وەزارەتا پەروەردێ | وەزارەتا پەروەردێ |
| وەزارەتا پەروەردێ | وەزارەتا پەروەردێ |

## شەرینا کەرەستێن ستاندەرد Standard Toolbar



**New**: بو ڤەکرنا فایلەکێ(دوکیۆمێنتەکێ) تازە (نوو).

**Open**: بو ڤەکرنا فایلەکێ (دوکیۆمێنتەکێ) هەلگرتی (ڤەگرتی).

## ڤەگرتنا فایلان (Save)

بۆ ڤەگرتنا پێزانینێن هەر فایلەکێ نوو بهێتە ڤەکرن فەرمانێ (**Save**) دهێتە بکارئینان وبڤی رەنگی:-

پشتی تێئخستنا چەند پێزانینا لیستا (**File**) کلیك بکە وپاش فەرمانێ (**Save**) هەلبژێرە یان لسەر شەریتا **Standard** کلیکێ لسەر ئایکونێ **Save** بکە، بۆکسەك بۆ تە دێ ڤەبیت لڤێرێ ل **Save in** درایڤێ خۆ دیار کەی بو نموونە ل درایڤێ (**D**).

لدەمێ تو جارا ئێکێ فایلەکی (دوکیۆمێنتەکی) ڤەدگری (**Save**) دڤێت ناڤەکێ تازە بۆ دابنی ونابیت دهەمان درایڤدا ناڤەکێ وەکی وی هەبیت.

دوی دەمیدا د (**File Name** ) دا ناڤەکی بنڤیسە وپاشی کلیکێ لسەر **Save** بدە،وبڤی شێوەی فایلی تە دکۆمپیوتەریدا دێ هێتە ڤەگرتن، هەر فایلەکێ ڤەگرتی دکۆمپیوتەریدا دشیان

دایە بهێتە ڤەکرن وگوهۆڕانکاری لسەر بهێتە کرن ودووبارە بهێتە ڤەگرتن بشێوێ نوو و تنێ برێکا کلیکککرنێ لسەر (**Save**) ژ شەریتا ستاندەرد یان ژ لیستا **File**.




## ڤەکرنا فایلێن ڤەگرتی Open

بۆ ئەنجامدانا گوهۆڕانکاریا ل سەر هەر فایلەکێ ڤەگرتی یان خواندنا ناڤەروکا فایلی یان هەر کارەکێ دی دناڤ فایلیدا پێدڤییە فایل بهێتە ڤەکرن وبڤی رەنگی :-لیستا **File** کلیك بکە و فەرمانێ **Open** هەلبژێرە یان لسەر شەریتا کەرەستا **Standard** ئایکونێ کلیك بکە دهەر دوو رێکاندا بۆکسەك بو مە دێ ڤەبیت و ل **Look in** دا ئەو جهێ فایل دناڤدا هاتیە ڤەگرتن (درایف + فولدەر) دیار بکە.

لدووڤدا ليستەك بناڤێ هەمی فایلێن دناڤ وی جهی دا دێ هێنە بەرچاڤکرن هەر فایلەکێ مە بڤێت ڤەکین دێ دەست نیشان کەین وکلیکەکێ لسەر دوگما (**Open**) دەین.




**Print**: چاپ کرن.

**Print Preview**: بەرچاڤکرن بەری چاپ کرنێ.

**Cut**: برين

**Copy**: کوپی کرن.

**Paste**:بو نیساندنا (بەشەکێ بری یان کوپی کری).

**Format Painter**: کوپی کرنا خەسلەتێن (تایبەتمەندیێن) بەشێ دەست نیشان کری.

**Undo** : لێ زڤرين ژپێنگاڤا دوماهيێ.

**Redo** : ڤەگەریان بو پێنگاڤا ئەم لێ زڤرین.

**Tables and Border**: بو بەرچاڤكرن وڤەشارتنا شەریتا كەرەستێن خشتەی (سنورا) چێوەی.

**Insert Tables** : بو دورستكرنا(دانان)ا خشتەی.

**Drawing** : بو بەرچاڤكرن وڤەشارتنا شەریتا كەرەستێن وێنەكێشانێ

100% **Zoom** : بودیار كرنا قەبارێ پیشاندانا فایلێ (مەزن، بچووك).

# شەریتا کەرەستێن وێنەکێشانێ

## Drawing Toolbar




ئەڤ شەریتە دهێتە بکار ئینان بو کارێ وێنە کێشانێ دناڤ پرۆگرامیدا، هەروەسا بۆ ئینانا وێنان ژ جهەکێ دی ونڤیسینێن هونەری و....هتد.




١. Auto Shapes: بۆ کێشانا شێوێن هەمە جور، بکلیکرنێ لیستەك بومە دێ دەرکەڤیت ژچەند بەشان پێك هاتیە وهەر بەشەکی جەندین شێوێن جۆرە وجۆر هەنە ودشیاندایە هەر شێوەیەکی ئەم وێنە کەین.



٢. بۆ دروستكرنا راستە هێلەكێ. 

٣. بۆ دروستكرنا تیشكەكێ. 

٤. بۆ دروستكرنا لاكێشەكێ وچوار گوشەكێ.

٥. بۆ دروستكرنا بازنەكێ. 

٦. Text Box: بۆ نڤیسنێ ودانانا وێنەكێ دناڤ بۆكسەكێدا




٧. Word Art(نڤیسینێن هونەری) : ب كلیككرنێ بۆكسەك بۆمە دەردكەڤیت كو چەندین جۆر هەنە هەر ئێك ژوان رەنگ وشێوێ خۆ یێ تایبەت هەیە، كلیككرن لسەر هەر ئێك ژوان وپاشی Ok دێ بۆكسەكا دی ڤەبیت ئێكسەر نڤیسینا خۆ دێ نڤیسین وكلیكێ لسەر (Ok) ددەین نڤیسینا مە دێ ب وی شێوێ هونەری ئەوێ هاتیە دەستنیشانكرن هێتە بەرچاڤكرن لسەر بەرپەڕی، بۆ گوهۆڕینا رەنگێ وی لسەر شەریتا Drawing كلیكێ لسەر Fill Color دكەین ورەنگەكێ دی بو دەسنیشان كەین، هەرووەسا بو چێوێ وێژی دهەمان شەریتێدا Line Color بو هەلبژێرین.



**نموونه :**



٨.**Diagram**: ب كاردهێت بو دروستكرنا هێلكاریان .

٩. **Clip Art**: ب كلیككرنێ ل لایێ راستێ یێ شاشێ پەنجەرەك دهێتە ڤەكرن ولدەمێ ئەم كلیكێ لسەر **Search** ددەین وێنە دێ دەركەڤن وهەر وێنەكێ ئەم كلیك بكەین دێ هێتە سەر بەرپەڕێ مە .



هەر وێنەیەکێ هەبیت دشیاندایە  دەستکاریێ دقەبارێ ویدا بکەین (بچووك كرن ومەزن كرن) لدووف پێدڤیا مە.





١٠. From Files: بکلیککرنێ بۆکسەك دێ بومە ڤەبیت و ل بن Look in  جهێ وێنەی (درایف+فولدەر) دێ هێتە دەستنیشانکرن ولدووڤدا ئەو وێنێ مە بڤێت دناڤ وی جهی دا دێ هێتە دەست نیشان کرن و دوگما Insert  لناڤ بۆکسێدا کلیك دکەین.



١١- Fill Color : بكليككرنێ بۆكسەك دهێتە بەرچاڤكرن كۆ ژ كۆمەكا رەنگان پێك هاتیە وهەلبژارتنا هەر رەنگەكی رەنگێ دی وێنی دەستنیشانكرن هێتە گوهارتن بۆ ئەو رەنگێ هاتیە هەلبژارتن.




**نموونە :**



١٢. Line Color: یێ تایبەتە بو رەنگ كرنا چێوان.

**نموونە :**






۱۳.Font Color: بۆ دیار کرنا رەنگێ نڤیسینێ.

**نموونە :**




کۆمپیوتەر کورد

۱٤.Line Style: بکلیککرنێ لسەر جۆرێ هێلان دهێنە دیار کرن کۆ د جیاوازن ژلایێ شێوە و قەبارەی ڤە وبۆ گوهۆرینا چێوێ وێنێ دەست نیشان کری دهێنە بکارئینان.

**نموونە :**



١٥.Dash Style: بۆ گوهۆڕینا شێوێ هێلان وچێوان.



**نموونە:**







١٦. Arrow Style: بۆ هەلبژارتنا جۆرێ راستەهێلێ وپارچە راستەهێلێ وتیشکێ دهێتە بکارئینان.




**نموونە:**














١٧. Shadow Style : بۆ هەلبژارتنا جۆرێ سیبەران دهێتە بکارئینان وهەر ئێك بجۆرەکی یە و بۆ لایەکی ڤەیە.

**نموونە :**






١٨. 3-D Style : ئەگەر مە بڤێت سێ دویریا دیاربکەین 3-D دێ ڤەکەین دوی دەمیدا ئێکێ دێ هەلبژێرین، وئەگەر مە بڤێت رەنگێ دوو دیری بگوهۆڕین دێ Setting 3-D کلیککەین شەریتەك دێ دەرکەڤیت ئەم دشێین رەنگین

خۆ بگوهۆڕین، وهەروەسا ئەم دشێین بزڤرینین بو هەر لایەکێ مە بڤێت، وئەم دشێین وێ گوشێ دەست نیشان بکەین ئەوا روناهی لێ ددەت ودووریا وان نزیك ودویر کەین.

**نموونە:**










## دروستكرنا خشتەی Table

دروستكرنا خشتا گەلەك یا گرنكە بو كارێن مە یێن روژانە وەك خشتێ روژانە یان خشتێ ئەزموونان یان هەر پێدڤیەكا دی. لڤێری دێ رێكەكێ ژ رێكێن دروستكرنا خشتەی دیار كەین.

بو دروستكرنا خشتەی ڤان پێنگاڤا دێ بكارئینین :

**Table → Insert → Table**

بۆكسەك دێ بۆ مە دەركەڤیت دناڤدا ژمارا ستووینا و رێزا دێ هێتە دەستنیشانكرن بڤی شێوەی

د( **Number of Columns** )دا ژمارا ستووینا دیار دكەین و هەروەسا ل( **Number of Rows** ) ژمارا رێزا دیار دكەین، پاشی كلیكێ لسەر **Ok** دكەین بو جێبەجێ كرنا داخازیا مە، بڤی شێوەی خشتە دێ دروست دبیت.

| | | | |
|---|---|---|---|
| | | | |
| | | | |

دەمێ ئەم خشتەیەكی دروست دكەین پێدڤیە ئەم شەریتا كەرەستا **Table and Borders** لسەر شاشێ دیار بكەین ژبەركۆ مە پێدڤی بچەند كەرستێن وێ هەیە ژبۆ گوهۆرینێن خشتەی.

ئەوژی ب رێکا کلیککرنا ئایکونێ (**Table and Borders**) کو دکەڤیتە سەر شەریتا کەرەستێن **Standard** دێ ئەو شەریتە دیار بیت و ب کلیککرنەکا دی دێ هێتە لادان. پشتی مە خشتە دروست کری هەر گوهۆڕانکاریەکا مە بڤێت (رەنگ و جۆرێ هێلا ) پێدڤیە خشتەی دەست نیشان بکەین پاشی کلیکێ ل سەر **Line Style** بکەین دێ ژمارەکا زور ژ جورێن هێلان دەرکەڤن هەر هێلەکا مە بڤێت بو خشتەی دێ کلیککەین ولدووڤدا ل **Line Weight** پاناتیا هێلان دێ دیار کەین، و ئەگەر مە بڤێت رەنگێ بگوهۆڕین ل ئایکونێ **Border Color** هەر رەنگێ مە بڤێت دێ دیار کەین، وپاشی ل **Outside Border** دا ئەو هێل ورەنگێ مە دیار کری دشێین بدەینە هەمی خشتەی یان بتنێ بۆ چێوێ ژدەرڤە یان هێلێن نافخو.... هتد. و ب ئایکونێ **Shading Color** رەنگێ دناف خشتەیدا دیار دکەین، ودشێین هەر ستووینەکێ یان رێزەکێ یان هەر خانەیەکێ رەنگەکێ تایبەت بۆ دیار کەین ئەوژی ب برێکا دەستنیشانکرنا هەر ئێك ژوانا ب شێوەیەکێ جودا ودەستنیشانکرنا رەنگەکێ تایبەت.

بو زێدەکرنا رێزا یان ستوینا دشێین لسەر خشتەی کارسەری بدانینە وی جهێ مەبەست پێ وپاشی کلیك ل سەر لیستا **Table** بکەین پاشی دێ لیستەك دیار بیت کلیکێ لسەر **Insert** دکەین لیستەکا دێ دێ دیار بیت لدووڤ پێدڤیا خشتەی دشێین کلیکێ لسەر فەرمانا مەبەست بدەین.

هەروەسا بو ژێبرنا ستوینەکێ یان ریزەکێ هەمان شێوێ زێدەکرنێ بکاردئینین لێ ل جهێ **Insert** دێ فەرمانێ **Delete** کلیك کەین.

## Table and Borders شەرينا

بۆ دروستکرنا خشتەى برێکا دەستى.
بۆ ژێبرنا هێلان دناڤ بەرا خانێن خشتەى.

بۆ جورێن هێلا.

بۆ پانیاتیا هێلا.

بۆ رەنگێ هێلا.

بۆ گونجاندنا چێوە و هێلێن دناڤ خشتەیدا.

بۆ رەنگکرنا خشتەى.

بۆ ئینانا خشتەى.

بۆ ژێبرنا هێلا دناڤبەرا دوو خانا یان زێدەتر.
بۆ دابەشکرنا خانا بۆ چەند خانێن زێدەتر.
بۆ گونجاندنا نڤیسینێ دخانانداا.
بۆ وەك هەڤکرنا پانیاتیا ستووینان.
بۆ وەك هەڤکرنا بلنداهیا رێزان.
بۆ گوهۆرینا شێوێ خشتەى.
بۆ گوهۆرینا ئاراستێ نڤیسینێ.

بۆ رێزکرنا ژ(A بۆ Z) و ژ(أ بۆ ي) و ژ (بچووك بو مەزن).

بۆ روونكرنەكا زێدەتر بۆ فەرمان وپێدڤیێن دروستكرنا خشتا لڤێرێ چەند نموونەیەك بۆ هەوە ئامادەكرینە.

نموونا ١/ دروست كرنا خشتەیەكێ پێك هاتی ژ ٦ ستوینا و ٤ رێزا

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | |
| | | | | | |
| | | | | | |

نموونا ٢/ دەستنیشانكرنا خانەیەكێ

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | |
| | | | | | |
| | | | | | |

نموونا ٣/ دەستنیشانكرنا رێزەكێ

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | |
| | | | | | |
| | | | | | |

نموونا ٤/دەستنیشانکرنا ستووینەکێ

نموونا ٥/ دەستنیشانکرنا هەمی خشتەی

نموونا ٦/رێکخستنا چێوێ خشتەی.

نموونا ٧/ رەنگکرنا خشتەی

نموونا ٨/ ژێبرنا هێلان دناڤبەرا خانان.

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | |
| | | | | | |
| | | | | | |

نموونا ٩/ دابەشکرنا خانان.

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | |
| | | | | | |
| | | | | | |

نموونا ١٠/ رێکخستنا نڤیسینێ دناڤ خاناندا.

| | | | وەزارەتا پەروەردێ | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | |
| | | | | | |

نڤیسین دناڤ خشتەیدا هەر وەکۆ نڤیسینا ئاسایی یا دناڤ بەرپەڕێن نڤیسینێ یە لێ دناڤ خشتەیدا پێدڤیە ئەو خانا مە دڤێت دناڤدا بنڤیسین پێش وەخت بهێتە کلیککرن، وبۆ ڤەگوهاستنا نیشاندەرێ نڤیسینێ ژ خانەیەکێ بۆ خانەیەکا دی هەر برێکا کلیککرنا ماوسێ چەپێ یان برێکا دوگما **TAB** لسەر کیبۆردی وئەڤ رێکە پتر دهێتە بکارئینان.

# راهێنان

## لایەنێ تیوری

پ ١/ ئەڤێن خوارێ پێناسە بکە.

( Clip Art , Open Save)

پ ٢/ مفایێ فەرمانێن خوارێ دیار بکە.

(Table , Copy , Print)

## لایەنێ پراکتیکی

پ ١/

أ- فایلەکێ نوو دروست بکە، ڤێ هوزانا لخوارێ دناڤدا بنڤیسە ب (font)ێ (Ali_K_Samik) و بقەبارێ (١٨) وبرەنگێ (شین)

ئەز مامە د حیکمەتا خودێ دا

کرمانج د دەولەتا دنێ دا

ئایا ب چ وەجھ مانە مەحکووم

بیلجو ملە ژ بۆ چ بوونە مەحکووم

ئەحمەدێ خانی

ب- بریکا (Word Art)ی بنڤیسە( پەرلەمانێ کوردستانێ)

پ ٢/ ئەڤ وێنێ لخوارێ دیار کری وێنەکە



لدووڤدا فايلی بناڤێ (ئازادی).د درايڤێ (D) دا ڤەگرە

پ٣/ فايلەکێ نوو دروست بکە، ڤێ هوزانا لخوارێ دناڤدا بنڤیسە ب (font)ێ (Ali_K_Samik) و بقەبارێ (٢٠) وبرەنگێ (سور)

نۆبل وەرگر کەلەپیـــاوان

دانا وزانا وپیتۆلەکـــان

کاربەدەس آتە بەرێزەکان

هەمووو قەرزاری مامۆستان

(گوران)

لدووڤدا فایلي بناڤێ ( کوردستان) دناڤ درايڤێ (D) دا ڤەگرە

پ٤/ فايلەکێ نوو دروست بکە، خشتێ دابەش کرنا وانا لسەر رۆژێن حەفتیێ دناڤدا دروست بکە وبڤی رەنگی.

| شەمبی | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ئێك شەمبی | | | | | |
| دوو شەمبی | | | | | |
| سێ شەمبی | | | | | |
| چوارشەمبی | | | | | |
| پێنج شەمبی | | | | | |

لدووڤدا فايلی بناڤێ (وانێن حەفتیێ) دناڤ درايڤێ (D) دا ڤەگرە.

# ناڤەروک